# شرحی قاعیدە ی

## من لم يكفر الكافر أو شك في كفره أو صحح مذهبه فهو كافر




شێخی موجاهید : أبو مالك التميمي
- أنس النشوان - (تقبله الله)



وەرگێڕان :
دابان تەوحیدی



پێگە ی





NAHAWAND

**بسم الله الرحمن الرحيم**

## پێشەکی وەرگێڕ

**الحمد لله ، والصلاة والسلام على رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ، وأشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدًا عبده ورسوله صلى الله عليه وسلم ، أما بعد ...**

بابەتەکانی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە یەکێکە لەو بابەتانەی کە زۆربەی خەڵکی بە هەڵە تێی کەوتوون ، هەیانە زیادە ڕەوی تێدا دەکات بە ئەندازەیەک کە هیچ موسلمانێکت بۆ ناهێڵێتەوە ئیللا تەکفیری دەکات مەگەر ئەو کەسانەی کە وەکو خۆیەتی ، بە نموونەش ئەمانەی تەکفیری عموم دەکەن جا دێن ئەو موجاهیدە عەقیدە پاکانە و موسلمانە موەحیدەکان تەکفیر دەکەن بەهۆی ئەوەی هەڵە حاڵی بووینە لەم هەڵوەشێنەرەوەیە ، بێ ئەوەی لە هەندێک بابەتدا هیچ قەید و مەرجێکی بۆ دابنێن ، وە هەروەها لە بەرامبەری ئەوانیشەوە مورجیئە پیسەکانن کە دەبینن کابرای عەلمانی دەیان کوفری هەیە هەموو گیانی کوفرە تەنها ئەوەیە بە زمانی دەڵێت موسلمانم! دەڵێن کەواتە ئەم قاعیدەیە ئەم کەسە ناگرێتەوە ، چونکە بیستوومانە لێیان کە دەڵێن ناترسیت کە ئەم وەلی ئەمرە تەکفیر بکەی و پاشان کوفرەکە بۆخۆت بگەڕێتەوە ! یعنی سبحان الله هیچ تەئویلێک نادات بەو کەسەی تەکفیری دەکات بەڵام دەیان تەئویل بۆ ئەو عەلمانیانە دەهێنێتەوە ، بۆیە هەر ناحاڵی بوونێک ڕوویدات لەم قاعیدەیەدا ئەوا تووشی سەر لێ شێواوی و لادان دەبیت . جا براکەم ئەم شەرحەی لەژێر دەستتە یەکێکە لە شەرحە بەسوودەکانی هەڵوەشێنەرەوەی سێیەمی ئیسلامە ، کە ئەویش قاعیدەی ( هەرکەسێک تەکفیری کافرێک نەکات ئەوا ئەو کەسە کافرە ) .

بۆیە تێڕامانەوە بیخوێنەوە بۆ ئەوەی نەبیت بەیەکێک لە زیادە ڕەوان یان شلڕەوان ، بەڵکو نێوەندگیر لەم نێوانەدا ، وە شێخ ابو مالك التميمی الله تعالی بە فیردەوسی شاد بکات زۆر بەجوانی و لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننە شەرحی دەکات ، کە سەرەتا چەند بنچینەیەکی شەرعی بۆ ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە دادەنێت و باسی دەکات پاشان باسی فەرع و لقەکانیشی دەکات ، کە تیایدا هەیانە ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ناو هەڵوەشێنەرەوەکە وە هەشیانە لەدوای اقامە حوججە دەکەوێتە ناویەوە ، جا پێویستە بە ووردی و لەسەرخۆییەوە بیخوێنیەوە بۆ ئەوەی بەجوانی تێبگەی ، وە ئەگەر لە هەندێک شوێن کەمێک ئاڵۆزی و لێ تێنەگەیشتن هەبوو ئەوا لە لاپەڕەکانی دواتر لەم ئاڵۆزیە تێدەگەی ، چونکە شێخ ئەمەی لە دەرس و محاضرەدا شەرح کردووە ، جیاوازە لەگەڵ ئەوەی کەسێک بە ئیسراحەتەوە دابنیشێت و کتێبێک بنوسێت و ووشەکان بەجوانی یەک لەدوای یەک ڕێز بکات ، بۆیە هەروەک وتم بە تێڕامان و ووردیەوە بیخوێنەوە بإذن الله تعالی سوودێکی یەکجار زۆری لێ دەبینی . وە برای بچوکیشتان لەدوعای خێر بێ بەش مەکەن لەگەڵ ئەو برایانەشی کا یارمەتی دەرمان بوونە ، الله تعالی إستقامە و ئیخلاص مان پێ ببەحشێت ، آمین ... .

والحمدلله رب العالمين

## وانەی یەکەم

**[ بسم الله الرحمن الرحيم ، الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على الأتمان الأكملان على أشرف الأنبياء والمرسلين ، نبينا محمد عليه وعلى آله أفضل الصلاة وأزكى التسليم ، سبحانك لا علم لنا إلا ما علمتنا إنك أنت العليم الحكيم ، اللهم فقهنا في الدين ، وعلمنا التأويل ، اللهم علمنا ما ينفعنا ، وانفعنا بما علمتنا ، وزدنا هدىً وتقىً وصلاحاً وسداداً ورشاداً يا رب العالمين ]**

خۆشەویست و بەڕێزانم لە وانەی ئەمڕۆکەدا بابەتێک لە بابەتە گەورەکان دەخوێنین لەگەڵتان کە ئەویش بابەتێکە کە ئەهلی عیلم براندوویانەتیەوە و اقراریان لەسەری کردووە لە کۆن و نوێدا ، وە ئەویش بابەتێکە کە لەسەر هەندێک کەس ئاڵۆز بووە ، وە تێی کەوتوونە بە چەندین جۆری شوبهە و لێ تێکەڵ بوون ، جا ئەگەر الله تعالی ویستی لێ بێت لەم وانانەدا هەوڵ دەدەین کە بنچینەیەکی جێگیر دابنێین بۆ ئەم بابەتە بە بنچینەیەکی شەرعی ، داوا لە الله تعالی دەکەین کە تەوفیق و پێکان بە ئێمە و ئێوەش ببەخشێت ...

قاعیدەیەک لە قاعیدەکانی شەرع کە ئەهلی عیلم براندوویانەتیەوە و إقراریان لەسەری کردووە ، ئاگاداربە کە ئەویش

" قاعیدەی : **هەرکەسێک کافرێک بە کافر نەزانێت یان گومانی هەبێت لە کوفرەکەی یان ڕێبازو بەرنامەکەی بە ڕاست دابنێت ئەوا ئەوکەسە کافرە** "

وە پێش ئەوەی کە دەست بکەین بە ڕوونکردنەوەی ئەو قاعیدەیە ، حەزدەکەم کە شێوازێکی دیاریکراو لەگەڵتان بەکار بهێنم لەم وانانەدا ، وە ئەمەش شێوازێکە لە شێوازەکانی تاقی کردنەوەیی ئاگاداربن کەئەویش سەرەتا بنچینەیەکی جێگیری بۆ دادەنێین پاشان بەشێوەی دابەشکردن و فەرع فەرع ، واتە ئێستا من بنچینە جێگیرەکانتان بۆ باس دەکەم پێش ئەوەی کە قسە دەربارەی بابەتەکانی ئەم قاعیدەیە بکەین ، چونکە مرۆڤ ئەگەر ئەو بنچینانە شارەزابوو ئەوا دابەش کردن

و فەرع فەرعەکانیش چاکتر شارەزا دەبێت ، هەروەکو چۆن جێگیر کراوە لەلای زانایانی أصول " کە أصل و بنچینە بریتییە لەوەی کە غەیری خۆی لەسەری بینا دەکرێت " " وە فەرع یش بریتییە لەوەی کە لەسەر غەیری خۆی بینا دەکرێت " ، ئایا لێرەدا جیاوازی هەیە یان نا ، بەڵێ هەیە ، جا ئەگەر مرۆڤ بنچینە دانانەکەی لەلا چاک بوو ئەوا دابەشکردن و فەرع ەکەشی لەلای صەحیح دەبێت ، وە ئەگەر خەلەل و کەم و کورِیەک لە أصل ەکەدا ڕوویدا ، ئەنجامی چی دەبێت ؟ ئەنجامی هەڵە ڕوودان دەبێت لە فەرع ەکەش ، لەبەرئەمە ئەهلی عیلم دەفەرموون : هەرشتێک لەسەر باطل بینا کرابێت ئەوا ئەوشتە باطل ە ، جا ئەگەر أصل ەکە صەحیح بوو ئەوا بینا کردنیش لەسەری پێویستە کە صەحیح بێت ، وە ئەگەر أصل ەکە فاسد و خراپ بوو ئەوا بەم شێوەیە بینا کردنەکەش فاسد و خراپ دەبێت .

یەکەم بنچینە لە بنچینە جێگیرەکان کە قسەی لەسەر دەکەین پێش ئەوەی قسە لەبارەی ئەم بابەتەوە بکەین کە دەکەونە ژێر پلەبەندی ئەو قاعیدەیە :

**بنچینەی یەکەم** : ئەوەیە کە ئەنجامدەری شیرکی گەورە لە بابەتە ظاهر و ئاشکراکان کافرێکی مورتەدە ، جا جاهیل و نەفام بێت یان تەئویلی هەبێت ... ( ئێستا ئەم بنچینانە باس دەکەین وە پێویستە کە بەچاکی لەگەڵمان بن لەژێر هەر بابەتێک کە قسەی تێدا دەکەین دەربارەی بابەتەکانی ئەم قاعیدەیە ، بۆیە پێویستە کە دەبێت ئەو بنچینانەی ئێستا باسی دەکەین لەگەڵمان ئامادە بن ) .

**بنچینەی دووەم** : قاعیدەی " هەرکەسێک کافرێک کافر نەکات " بریتییە لەو قاعیدەیەی کە ئیجماعی لەسەرە لەنێوان سەلەفی ئەم ئوممەتە و زانا گەورەکان ، وە ئەو ئیجماعەش بە شێوەیەکی گشتی ئیجماعی لەسەرە ، وە ووردەکاری هەیە کە لە ناوەندی قسەکانمان دەربارەی بابەتەکانی ئەم بەشە ڕوونی دەکەینەوە إن شاء الله تعالى ، کە تەفصیل و ڕوونکردنەوەی تێدایە .
کەواتە دەڵێین بێگومان ئەهلی عیلم جێگیریان کردووە کە " هەرکەسێک کافرێک بە

کافر نەزانێت خۆی کافر دەبێت " ، بەڵام کەی کافر دەبێتەوە ؟ ئەمە ئەوەیە کە إن شاء الله لە ناوەندی وانەکانی ئەو قاعیدەیە بە دەستی دەهێنین ، کەواتە ئەم قاعیدەیە بەم شێوەیە نییە کە بەم إطلاق ی و ڕاهاییەوە کە هەندێک کەس گومانیان بردووە ، بەڵکو چەندین ضابط و قید ی هەیە کە دواتر ڕوونی دەکەینەوە إن شاء الله .

**بنچینەی سێیەم** : ئەوەیە کە ئەو قاعیدەیە بەم شێوەیە نییە هەروەکو چۆن هەندێک کەس دەڵێن و بانگەشەی دەکەن کە لە بیدعەکانی پێشەوا محمدی کوڕی عبد الوهاب ە ( ڕەحمەتی الله تعالى لێ بێت ) چونکە لە گومڕاکان کەسانێک هەنە کە دەڵێن ئەم قاعیدەیە داهێنراوە وە داهێنەرەکەشی پێشەوا محمدی کوڕی عبد الوهاب ە جا ئەمە دوورە لە ڕاستیەوە و ڕاست نییە ، وە ئەمەش بانگەشەیەکی بێ بەڵگەیە بەڵکو ئەمە بوهتان و درۆیەکی تەواوە بەڵکو بەڕاستی ئەم قاعیدەیە لەلای ئەهلی عیلم جێگیر کراوە و إقراری لەسەر کراوە هەر لە کۆنەوە ، وە ئەو کەسەی کە ووتەی ئەهلی عیلم دەخوێنێتەوە و بەدوایدا دەگەڕێت ، ئەوا دەبینێت کە ئەم قاعیدەیە دیار و ئاشکرایە لە أصل و بنچینە دانانەکانیان ، جا بەڕاستی ئەمە گێڕدراوەتەوە لە سوفیانی کوری عویەییەنەوە ، وە هەروەها ئیمامی أحمدی کوڕی حەنبەل ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) وە أبو زرعة و محمدی کوڕی شحنون وە هەروەها أبوبکری کوڕی عیاش وە یزید ی کوڕی هارون وە گشت زانایانی سەلەف وە هەروەها شیخ الإسلام إبن تیمیة و قاضی عیاض و زانایانی دەعوە ( واتە : زانایانی نەجدی ) وە جگە لەوانیش لەو کەسانەی کە لێیانەوە گێڕدراوەتەوە و ئەو قاعیدەیان چەسپاندووە و إقراریان لەسەری کردووە ، کەواتە ئەو قاعیدەیە بەم شێوەیە نییە هەروەکو چۆن هەندێک کەس دەڵێن لە داهێنراوی پێشەوا محمدی کوڕی عبد الوهاب ە بەڵکو ئەوە قاعیدەیەکە سەلەفی ئومەت لە کۆنەوە قسەیان لەبارەیەوە کردووە ، جا ئەو کەسەی کە بەدوای ئەم قاعیدەیە و ووتە نەقڵ کراوەکانیان دەگەڕێت ئەوا ئەو قاعیدە دیار و ڕوونە لە کاتی ئەو ووتە نەقل کراوانەی کە لێیانەوە

گێڕدراوەتەوە دەبینیت و دەستی دەکەوێت ، وە إن شاء الله تعالی ئەو ووتە نەقل کراوانە باس دەکەین و لەکاتی هەندێک لەم ووتانە دەوەستین و هەڵوێستەیەکی لەسەر دەکەین .

**بنچینەی چوارەم** :ئەویە کە ئەنجام دانی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە کەوتنە ناو کوفرە بە ئیجماعی زانایان ، وە کوفریش پێوەی دەلکێ لە سەرەتادا لەو شوێنەدا وە لەدوای إقامە حججە کردن لەو شوێنانەدا هەروەکو ڕوونکردنەوە و تەفصیلەکەی لە وانەکانی داهاتوو دێینە سەری ، وە ئەمەش ئەوەیە کە چەسپێندراوە لەپێش ئەو بنچینەیەی کە ئەو قاعیدەیە بە گشتی ئیجماعی لەسەرە ، وە ڕوونکردنەوەشی تێدایە .

**بنچینەی پێنجەم** : ئەوەیە کە مناط ی کوفر لەم هەڵوەشێنەرەوەیە بریتییە لە ( بەڕاست دانەنان و نکۆڵی کردن و ڕەت کردنەوەی حوکمێکی الله تعالی یە لەدوای ناسینی ) وە ئەو مناط ەش بەڵگەی زۆری لەسەرە لە کتێبی الله عز وجل دا ، الله تعالی دەفەرموێت :
{ ولكن الظالمين بآيات الله يجحدون }واتە : بەڵکو ئەو ستەم کارانە ئایەتەکانی الله ئینکار دەکەن . وە هەروەها الله سبحانه وتعالی دەفەرموێت : { وما يجحدُ بآياتنا إلا الظالمون }واتە : تەنیا ستەمکاران دان نانێن بە نیشانەکانی ئێمەدا . وە الله تعالی دەفەرموێت : { و ما يجحدُ بآياتنا إلا الكافرون }واتە : تەنیا بێ باوەڕانی ( ڕۆچوو ) دان نانێن بە ئایەتەکانی ئێمەدا .

ئەم بنچینەیە لەبەربکە و پەیوەستی بە لەگەڵمان لەکاتی قسەکردنمان لەم بەشەدا لەبەر گرنگیەتی لە شوێنەکەدا ، چونکە ئێمە هەروەکو چۆن إقرارمان کرد کە ئەو مەنهەجەی بینا دەکرێت لەسەری بریتییە لە بنچینە دانان پاشان دابەش کردن و فەرع فەرع کردن ، لەبەرئەوەی هەڵەکردن زۆرجار لەچی ڕوودەدات ؟ یان لە دابەش کردنەکە و فەرعەکەیە بەبێ بنچینە دانان یان لە بنچینە دانانێکی هەڵەیە پاشان لە

دابەش کردن و فەرعەکە ، یان هەندێکیان فەرعەکان وەردەگرێت لە بنچینەدا لە هەندێک بابەتدا ، کە ئەویش لە هەندێک حاڵەتدا دەبێت بەڵام دەبێتە هۆی تێکچوونی مەنهەجی عیلمی لەزۆربەی جاردا هەڵە و انحراف و لادان ڕوودەدات ، لەبەرئەمە دەبینین کە فیرقە هەیە گومڕا بووە بەهۆکاری چی ؟ بەهۆکاری خەلەل و کەم و کوڕی لە بنچینەدانانەدا ، بۆ نموونە : بەڵگەیەکی متشابە پێشدەخەن بەسەر موحکەم ێکدا یان موحکەم ێک دەکەنە متشابە یان دەیکەنە أصل ێک کە بینای لەسەری دەکەن لە حاڵێکدا موحکەم ێکی جێگیر هەیە ... وە بەم شێوەیە .

**بنچینەی شەشەم** : لە گشتگیر کردنی ئەو قاعیدەیە دەردەچێت ئەویش ئەو بابەتە خیلافیە ئیجتهادیانەیە کە ئەهلی عیلم إختلافیان تێیدا هەیە وە ئەویش لەبەر ئەم نموونانە ، وەک : حوکمی نوێژ نەکەر و ڕۆژوو نەگر و زەکات نەدەر و ئەنجام نەدەری حەج وە بەم شێوەیە ، وە قسەی ئێمە لێرەدا دەربارەی خیلافی ئەهلی عیلمە لە وازلێ هێنان دا ، نەوەک لە إنکاری و نکۆڵی کردن دا ، چونکە ئەو کەسەی کە نکۆڵی دەکات إتفاق لەسەرە هەتاوەکو مرۆڤ ئەگەر ئەنجامیشی بدا و هەستا بە ئەنجامدانی ئەم کردەوانە لەکاتێکدا انکاری و نکۆڵی دەکرد لە واجبیەتیەکەی ئەوا ئەو کەسە کافرە ، پیاوێک بەردەوامە لەسەر پێنج نوێژەکان وە لە یەک نوێژ کردنیشدا دواناکەوێت بەڵام ئینکاری لە واجب بوونەکەی دەکات ئەوا کافر دەبێت ، پیاوێک پابەندی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان دەبێت وە هەرگیز ڕۆژووی لێ ناخوات و لێی دوا ناکەوێت بەڵام ئینکاری لە واجب بوونی دەکات ئەوا کافر دەبێت هەتاوەکو ئەگەر بە ڕۆژووش بێت . کەواتە ئینکاری کردن بابەتێکە و واز لێ هێنانیش بابەتێکی ترە ، بەهەمان شێوە دەردەچێت لە عمومی ئەو هەڵوەشێنەرەوەیە مەوانیع ێک کە ئەهلی عیلم ئیختلافیان هەیە لە بەشێکی بۆ نموونە : " بلوغ بوون بە مەرج دانراوە بۆ صحەتی کەوتنە ناو ڕیددەوە " ، واتە : لە مەرجەکان یان جێگیر بوونی ڕیددە ( بالغ بوونە ) ، ئەمەش شوێنی خیلافە لەنێوان ئەهلی عیلم ، وە شوێنی خیلافەکەش بریتییە لە " ( سن التمييز ) واتە : تەمەنی جیاکردنەوەی شتەکان .

ڕێگایەکی أصولی هەیە کە ئەهلی عیلم بەسەریدا دەڕۆن ناویان لێ ناوە : ( ئازاد کردنی جێگایە ناکۆکەکان ) ، کێ ئازاد کردنی جێگایە ناکۆکەکانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە ؟ ( هەندێک لە ئامادە بووەکان وەڵام دەدەنەوە ) ، بەڵێ ... ( ئازاد کردنی شوێن و جێگایە ناکۆکان ) بریتیە لە : باسکردنی خاڵە إتفاقیەکان پاشان لەدوای ئەمە باسکردنی خاڵە خیلافیەکانە .

جا بۆ نموونە : ئەهلی عیلم اتفاقن و یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە کەسی پێگەیشتوو ( بالغ ) دەکەوێتە ناو ڕیددە و هەڵگەڕانەوە ، وە بەئاگا دەهێنرێتەوە و ڕاست دەکرێتەوە و دەگیرێت و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت و سزا دەدرێت ، وە هەروەها ئەهلی عیلم إتفاقن لەسەر ئەوەی کە منداڵ کە نەگەیشتووەتە تەمەنی جیاکردنەوەی شتەکان ڕیددە و هەڵگەڕانەوە بەسەریدا ڕوونادات و ناکەوێتە ناویەوە ، وە ئەمەشمان لەپێشوودا ڕوونکردەوە ، وە گوتمان ئەگەر هاتوو منداڵێک هەبێت کە هەندێک دەستەواژەی کوفری لێیەوە دەربچێت ، بۆ نموونە : بە منداڵێک بگوترێت : الله ـت خۆش دەوێت ؟ ، دەکرێت کە بڵێت : نەخێر ، ڕەنگە کە جۆرە دەستەواژەیەک دەرببڕێت هاوشێوەی ئەم دەستەواژەیە جا ئەو لەئێستادا نەگەیشتووەتە تەمەنی جیاکردنەوەی شتەکان ، جا ئایا درووستە کەوا لەم حاڵەتە بکەوێتە ناو ڕیددەوە ؟ دەڵێین : نەخێر ، وە ئەمەش جێگای إتفاقە ، ئەو قۆناخەشمان لا ماوەتەوە کە ئەویش نێوانی ئەو دوو تەمەنەیە ( تەمەنی پێگەیشتن و بالغ بوون لەگەڵ لەسەرووی تەمەنی جیاکردنەوەی شتەکان ) ، جا تەمەنی جیاکردنەوەی شتەکان لێرەدا ئەهلی عیلم إختلافیان هەیە لەسەر حەددەکەی ،

جا هەیانە دەڵێت : حەددی تەمەنی جیاکردنەوەی شتەکان ئەو منداڵەیە کە شارەزای قسە و گفتوگۆ دەبێت وە وەڵامدانەوەشی چاک دەبێت ، واتە ئەگەر پرسیار کرا لە پرسیارەکە تێدەگات وە باشیش وەڵام دەداتەوە ، ئەم ضابط ـە بۆ تەمەنی جیاکردنەوەی شتەکانە لەبەرئەوەی تەمەنێکی دیاری کراوی نییە ، جا ڕەنگە زوو پێ بگات وە ڕەنگیشە دوا بکەوێت ، جا ڕەنگە منداڵ هەبێت گەیشتووەتە حەوت ساڵی

بەڵام ئێستاش نەگەیشتووەتە ئەو حەددە ، وە هەندێکیشیان هەیە نەگەیشتووەتە ئەو تەمەنەوە بەڵام دەتوانێت کە شتەکان جودابکاتەوە .

ووتەی دووەم : کە ئەویش صەواب و ڕاستە والله تعالی أعلم ، کە حەددی تەمەنی جیاکردنەوەی شتەکان بریتییە لە تەمەنی حەوت ساڵی ، جا ئەگەر منداڵ گەیشتە تەمەنی حەوت ساڵان ئەوا لە ناحیەی شەرعیەوە بە کەسێکی جیاکەرەوەی شتەکان حساب دەکرێت ، وە ئەو ڕایەش بەڵگە پشتگیری دەکات ، کاتێک کە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : ( فەرمان بکەن بە منداڵەکانتان بە نوێژ کردن لە تەمەنی حەوت ساڵی ، ( وە ئەگەر نەیانکرد ) لەسەر نوێژ نەکردن لێیان بدەن لە تەمەنی دە ساڵی ) ، جا لێرەدا داوا لێ کردن و تەکلیف هەیە وە شتێک هەیە کە ئاراستە کردنی گفتوگۆی شەرعیە بۆ منداڵ لە تەمەنی حەوت ساڵیدا ، بیناش لەسەر ئەمە دەزانین کە تەمەنی جیاکردنەوەی شتەکان پێگەیشتووە کە ئەویش لە تەمەنی حەوت ساڵیە تاکو بالغ بوون ، وە بالغ بوونیش گوتمان چی ڕوودەدات ؟ سێ شت لە ئاست کوڕ وە ئافرەتیش شتێکی تریشی زیاترە کە ئەویش سوڕی مانگانەیە ، کوڕیش بە دابەزینی مەنی و دەرکەوتنی مووی دڕ لە پێشەوەی ، وە بالغ بوونیش لە پانزە ساڵیە .

جا ئایا دەکرێت کە کوڕ بالغ بێت پێش پانزە ساڵی ؟ دەڵێین : بەڵێ ، وە هەروەها ئەهلی عیلمیش جیاوازیان کردووە لەنێوان ناوچە ساردەکان لەگەڵ ناوچە گەرمەکان ، وە قسە کردنیش دەربارەی ئەمە دوورو درێژە ، مەبەستمە لە باسکردنی ئەم بابەتە ، کە ئێستاکە بە مەرج دانراوە بالغ بوون لە جێگیر بوونی ڕیددە یان صیحەتی ڕیددە جێگای خیلافە لەنێوان ئەهلی عیلم ! .

جا بۆ نموونە : ئیمام أبو حەنیفە ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) و هاوەڵەکەی محمدی کوڕی الحسن وە هەروەها ئیمامی أحمد لە ڕیوایەتێکدا پێیان وایە : کە باڵغ بوون مەرجێک نییە بۆ صیحەت و جێگیربوونی ڕیددە ، چۆن لەمە تێبگەین ؟ ئەو کەسەی

کە گەیشتووەتە تەمەنی جیاکەرەوەی شتەکان ئەگەر ووتەیەکی کوفری لێیەوە دەرچوو یان کردەوەیەکی کوفری ئەوا حوکمی کوفری بەسەردا دەدرێت ، تەنها ئەوەیە کە ئەوان دەڵێن : حوکمەکانی إستتابە دوادەخسترێت تاکو حەددی بالغ بوون ! باشە ، سوود چییە لەم جیاکردنەوەیە ؟! بەڵێ ، هەتا ئەگەر حوکمەکانی إستتابەش دوابخسترێت بەڵام ئەگەر حوکمی ڕیددە درا بەسەر کەسی جیاکەرەوەی شتەکان لەم حاڵەتەدا ئەوا میراث نابردرێت لەنێوان ئەو و لەنێوان کەسە نزیکەکانی لە موسلمانەکان ، وە ئەگەر خێزاندار بوو جێبەجێ دەبێت بەسەری ئەو ڕیددەیە بەهەمان شێوە پەیمانی عەقدی خێزاندارییەکەشی هەڵدەوەشێتەوە ، ئایا تەصەور دەکرێ منداڵێکی جیاکەرەوەی شتەکان خێزاندار بێت ؟ بەڵێ هەیە .

ڕایەکی تر هەیە : کە ئەویش ڕای أبو یوسف ـە لە هاوەڵەکانی أبو حەنیفەیە وە ڕای شافعی ـە وە أحمد لە دوو ڕیوایەت لێیەوە دەرکەوتووە ، وە ئەویش ئەوەیە کە ڕیددە و هەڵگەڕانەوە جێگیر نابێت وە صەحیح نابێت لەو کەسەی کە لە تەمەنی جیاکەرەوەی شتەکان دایە کە نەگەیشتووەتە تەمەنی بالغ بوون .

وە بیناش لەسەر ئەو ڕایە حوکمی تەمەنی جیاکەرەوەی شتەکان وەک حوکمی کێ دەبێت ؟ وەک حوکمی کەسێکە کە نەگەیشتووەتە تەمەنی جیاکەرەوەی شتەکان ، واتە لەسەر ئەو ڕایە ئەو منداڵەی کە لە تەمەنی جیاکەرەوەی شتەکان دایە وە ئەو منداڵەشی کە لە تەمەنی جیاکەرەوەی شتەکاندا نییە لە ڕووی حوکمەوە یەکسانن ، وە ئەوەش صەوابە والله تعالى أعلى و أعلم ، لەڕووی ئەوەی کە خیتابی شەرعی وە تەکالیفە شەرعیەکان دەبەسترێتەوە بەچیەوە ؟ بە بالغ بوون ، ( هەروەک رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ) " قەڵەم لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە : وە یەکێک لەوانەی کە باسی کردووە منداڵە هەتاوەکو بالغ دەبێت " ، وە باسی نیشانەکانی بالغ بوونیشمان کرد ، بە هەمان شێوەی ئەمە بڵێ لە ئاست کەسی مەست ( سەرخۆش ) چونکە نەمانی عەقڵ ئەهلی عیلم پۆلێنیان کردووە یان ئەهلی

عیلم دابەشیان کردووە بۆ چەند بەشێک : ( نەمانی عەقڵ بەهۆکاری موباح و ڕێ پێدراوێک ، نەمانی عەقڵ بە هۆکاری حەڕام کراوێک ) ،

نەمانی عەقڵ بە هۆکارێکی ڕێ پێدراو : هەیانە بە هەڵبژاردەی مرۆڤە ، وە تیایەتیشی بە هەڵبژاردەی مرۆڤ نییە .

ئەوەی بە هەڵبژاردەی مرۆڤە : وەکو ئەنجامدانی نەشتەرگەری بۆ کەسێک کە دکتۆرەکە پێی دەڵێت : ( بەنج ـت لێ دەدەین ) جا پەسەندی دەکات لەسەر ئەمە ، لێرەدا نەمانی عەقڵ بە هۆکارێکی ڕێ پێدراوە یان حەڕام ؟ بە هۆکارێکی ڕێ پێدراوە ، وە ئەو هۆکارەشی کە لە ویستی مرۆڤ دەرچووە وەکو : بورانەوە ، سەرع ، وە جار هەیە مرۆڤ چاوەکانی بەسەریدا زاڵ دەبێت و خەوی لێ دەکەوێت .

وە نەمانی عەقڵ بە هۆکارێکی حەڕام ، وەکو چی ؟ وەکو : خواردنەوەی مەی ، بەڵام نەمانی عەقڵ بە هۆکارێکی ڕێ پێدراو ئەوا ئەهلی عیلم یەک دەنگن لەسەر ئەوەی کە ڕیددە بەسەریدا ڕوونادات ، وە ئەمە موضع ی شاهد نییە ، موضع ی شاهد لە مەستی و سەرخۆش بوون ـدایە ، لێرەدا ئەهلی عیلم ڕا جیاوازن ، جا هەیانە دەڵێت : کەوا دەکەوێتە ناو ڕیددەوە ، وە هەیانە دەڵێت : کەوا ناکەوێتە ناو ڕیددەوە ، ئایا ئەو شێوەیە دەچێتە ژێر ئەو قاعیدەیە ؟ ئایا ئەو شێوەیە لە تەمەنی جیاکردنەوەی شتەکان لەوەی کە ئەهلی عیلم ڕا جیاوازیان تێیدایە دەچێتە ژێر ئەو قاعیدەیە ؟ دەڵێین : نەخێر ، لەبەر ئەوەی ئێمە جێگیرمان کرد کە ئەو بابەتانەی خیلافی تێدایە ئەوا شوێنی اجتهادە لەنێوان ئەهلی عیلم کە ئەویش لە دەرەوەی ئەم قاعیدە دایە ، جا ناکرێت کە کەسێک بێت و بینای بکات ، سەیربکە ئەگەر بنچینەکە بووە بنچینەیەکی نا درووست ئەوا دابەشکردن و فەرعەکەش بە نا درووستی لێیەوە دەردەچێت جا بنچینەیەک دابنێت و بێت و بڵێت : ( تۆ تەکفیری کەسێکی لە تەمەنی جیاکەرەوەی شتەکانت نەکردووە کەواتە تۆ کافری ) ، ( تۆ ئەو کەسەت تەکفیر نەکردووە کە ڕیددەیەکی لێیەوە دەرچووە یان ووتەیەکی کوفری لەکاتێکدا ئەو کەسە

سەرخۆشە کەواتە تۆ کافری ) ، لەگەڵ ئەوەی کەوا ڕاستە لە ووتەی ئەهلی عیلم هەیە : کە دەربڕینی ووتەی کوفری کە لە کەسی سەرخۆش دەرچووە پێی دەکەوێتە ناو ڕیددەوە ، بەڵام حوکمەکانی إستتابەی دوا دەخسترێت تاکو دوای بەهۆش هاتنەوە ، چونکە ئەو ووتەیە بەربەستی تێدایە ، چونکە مرۆڤ هەیە ڕەنگە هەڵە بکات وە بە سووک سەیری مەسەلەیەک بکات کە قسە بکات لە ووتە کوفریەکان یان کردارە کوفریەکان جا پاشان بچێت بەرەو چی ؟ بەرەو مەی خواردنەوە ، لەپێناوی ئەوەی کە ئەمە ببێتە هۆیەک یان بیانوویەک بۆ ئەو ووتە کوفریانە یان ئەو کردارە کوفریانە ، چونکە لە تاوانبارەکان کەسانێک هەنە کە فقهـ و علمیان هەیە ، جا لەبەر ئەمە ئەهلی عیلم لە هەندێک حاڵەتدا دانیان پێدا ناوە کەوا مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت بە پێچەوانەی مەبەستەکەی ، بێگومان لێرەدا مەبەست لەوە نییە لە دەرخستنی بابەتێک بە تەفاسیلیەوە وە دەرخستنی چەند بەڵگەیەک بۆ هەر یەک لەم دوو ووتەیە ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە لێرەدا جوزئیات هەیە ، وە چەند بابەتێک هەیە ، وە موانع هەیە ، کە خیلاف ڕوویداوە لەنێوان ئەهلی عیلم جا ئەوە لە غەیری پلە بەندی ژێر ئەو قاعیدە دایە .

وە بەهەمان شێوە یەکێک لە بابەتە گرنگەکان ڕێگری ( مانع ) ی ئیکراهە " مانع ێکە کە زانایان یەکدەنگن لەسەری " بە شێوەیەکی گشتی ، بەڵام هەندێک لە ئەهلی عیلم ڕا جیاوازیان تێیدا هەیە لە بەشێکی جوزئیاتیەکەی .

جا بۆ نموونە : ئیکراهـ مان هەیە پێی دەوترێت ( إكراه الملجئ و إكراه غير الملجئ ) ئایا جیاوازی لەنێوان ئەو دووەدا هەیە ؟ ضابط ی إكراه الملجئ چییە ؟ بەڵێ ( برایەک لە ئامادە بووەکان وەڵام دەداتەوە و ژمارەیەک نوقات باس دەکات ) ،

( ضابط ی إكراه الملجئ چییە ؟ ) بەڵێ ،

بەڵام ئەهلی عیلم بەهەمان شێوە لەم جوزئییەش ئیختلافیان هەیە ، هەیانە بابەتەکەیان فراوان کردووە لە لایەنەکەوە ، وە هەشیانە بابەتەکەیان تەسک کردۆتەوە لە لایەنەکەوە .

جا بۆ نموونە : هەندێکیان دەڵێن : " إكراه الملجئ " تەنها بە زیندانی کردن دێتەدی ، وەک شافعیەکان ، وە هەیانە بابەتەکەی تەسک کردۆتەوە هاوشێوەی ئەمە وە دەڵێن : إكراه الملجئ نایەتە دی هەتاوەکو مرۆڤ هەڕەشەی لێ دەکرێت بە کارێک کە لەناو چوونی گیانی تێدایە یان لەناو چوونی ئەندامێکی لاشەی تێدایە یان سزا و ئەشکەنجە دانێک کە نەفسێکی تەندرووست توانای نەبێت ، بۆچی وتمان نەفسێکی تەندرووست ؟

واتە : لە هەندێک خەڵکیدا لەوانەیە یەک قامچی وای لێ بکات هەموو شتێک بڵێت ، یان هەندێکیان هەر بەبێ قامچی ، وە بۆ نموونە هەندێکیان " نەخێر " ڕەنگە بەرگەی سەدان قامچی بگرێت بەڵام لێرەدا ئەگەر شتێکی دیاری کراو نەبوو ئەوا چارەنوسی بۆ چی دەبێت ؟ بۆ عورف وە بۆ ناوەڕاستترینی حاڵی خەڵکی ، جا ئەگەر ناوەڕاستترینی حاڵی خەڵکی بە نموونە پەنجا قامچی بەهێز بوو ، ئەوا لێرەدا بەم نموونەیە إكراه الملجئ دێتەدی وە بەم شێوەیە .
جا شایەت لە باس کردنی ئەم بابەتە ئەوەیە کەوا بینایە لەسەر ئەو خیلافە ، ئایا شێوەی ئەو خیلافە دەچێتە ژێر ئەو قاعیدەیە ؟ دەڵێین : ( نەخێر ) ، وە بەهەمان شێوە دەڵێین کە ئەهلی عیلم کەوا ئیختلافیان هەبووە و وتوویانە : ( ئایا بۆ إكراه هەڕەشە لێ کردن بەسە ؟ یان پێویستە کە سزا و ئەشکەنجەکەی بدرێت ؟ ) جمهوری زانایان بە پێچەوانەی ئیمام أحمد فەرموویانە : بەڵێ ، هەڕەشە لێ کردن بەسە .
مانای هەڕەشە لێ کردن چییە ؟

دەڵێت : ئەگەر ئەم کارە ئەنجام نەدەیت ئەوا ئێمەش ئەم کارەت بەرامبەر ئەنجام دەدەین ، وە جمهوری زانایان فەرموویانە : بەڵێ هەڕەشە لێ کردن بەسە ،

بەڵام ئیمامی أحمد فەرموویەتی : " نەخێر " ڕەحمەتی الله لە ئیمامی أحمد بێت فەرموویەتی : نەخێر هەتاوەکو سزا و ئەشکەنجەکەی دەدرێت ، لەبەرئەمە زانایانی ئەهلی سیرە دەفەرموون : کە یەحیای کوڕی معین ( رەحمەتی الله تعالی لێی بێت ) چووە لای ئیمام أحمد ، یەحیای کوڕی معین ڕوخسەتی وەرگرتبوو ! دەستی بە ڕوخسەتەوە گرتبوو بۆیەش لە زیندان ئازاد کرابوو بەڵام ئیمامی أحمد (رەحمەتی الله لێی بێت ) نەخێر ! دەستی بە عەزیمەتەوە گرتبوو وە پابەندی ڕایەکەی خۆی ببوو جا کاتێک یەحیای کوڕی معین چووە لای بۆ سەردانی کردنی ڕەحمەتی الله لە هەموویان بێت ، ئیمامی أحمد ڕووی لێ وەرگێڕا ، یەحیای کوڕی معین فەرمووی : ئەی باوکی عبدالله فەرموودەکەی عەمار ! ، ڕەددی نەکردووەتەوە ، سەیری شکۆ و ڕێزی یەحیای کوڕی معین بکەن ( رەحمەتی الله لێی بێت ) ، ئیمامی أحمد ، ئاڵایەکە لە ئاڵاکان ، وە خزمەتکارێکە لە خزمەتکارەکانی سوننە ، جا ئیمامی أحمد ڕووی لێ وەرگێڕا ، جا تێبینی بکەن و سەیربکەن ئیمام أحمد تەکفیری نەکرد لەگەڵ ئەوەی کەوا ڕوخسەتی وەرگرتبوو بەچی ؟ بە هەڕەشە لێ کردن ، لێرەدا فەرموویەتی هەڕەشە لێ کردن بە إكراه الملجئ دێتەدی وە بیناش لەسەر ئەمە بەهۆی ئەم ڕوخسەتەوە ڕوخسەت وەردەگرێت ، جا کاتێک یەحیای کوڕی معین ویستی بچێتە دەرەوە ، ئیمامی أحمد فەرمووی : (بەڵگە دەهێنرێتەوە بە فەرموودەی عەمار ، وە عەماریش سزا و ئەشکەنجە درابوو) .

عەمار بەسەرهاتەکەی دەزانن ، لێیدرا و ئەشکەنجە درا و ئەزیەت درا هەتاوەکو کاتێک هاتەوە بۆلای پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) چی پێ فەرموو ؟ فەرمووی : ( موشریکەکان وازیان لێ نەهێنام ، هەر ئازارو ئەشکەنجەیان دام ، هەتا ناچاریان کردم کە قسە بەتۆ بڵێم ) ، هەتاوەکو قسەی بە پێغەمبەر ووت ( صلى الله عليه وسلم ) ، پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) پێی فەرموو : ( دڵت چۆن بوو ؟ ) ،

عەمار فەرمووی : ( دڵم ئارام و دڵنیا بوو بە ئیمان و باوەڕ ) ، پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) پێی فەرموو : ( ئەگەر ئەوان دووبارە ئەشکەنجەیان دایەوە ، تۆش دووبارە ئەو قسانە بکەوە ) ، وە ئەگەرچی هەندێک لەو ڕیوایەتانە قسەی لەسەرە ، بەڵام ئەهلی عیلم بەردەوام تەفسیری ئەو ئایەتەی پێ دەکەن .

جا لێرەدا بۆمان دەرکەوت ئەوە جوزئیاتە ، ئایا هەڕەشە لێ کردن بەسە یاخود واجبە کە سزا و ئەشکەنجەی بدرێت ؟ ئەوە خیلافی تێدایە بۆیە بینا لەسەر ئەو وتەیەی کە دەڵێت : ( بەمەرج دانراوە کەوا پێویستە لە تەحقیق کردن و هێنانەدی إكراه الملجئ دەبێت سزا و ئەشکەنجە بدرێت ) بینا لەسەر ئەمە ئەو کەسەی کە وەڵام دەداتەوە بەبێ ئەوەی کە سزا و ئەشکەنجە بدرێت وە هەر بە هەڕەشە لێ کردنەکە اكتفاء بکات و بەسی بکات ، بینا لەسەر ئەو بنچینە دانانە ئەوا ئەو کەسە کافرە ! ، بەڵام دەڵێین ئەو بابەتانە ناچێتە ژێر ئەو قاعیدەیە ، قاعیدەی ( هەرکەسێک تەکفیری کافرێک نەکات یان گومانی هەبێت لە کوفرەکەی یان ڕێباز و بەرنامەکەی بەڕاست دابنێت ئەوا کافر بووە ) . وە ڕەنگە یەکێک بێت و بابەتێکی خیلافی إجتهادی تێوەی بگلێنێتە ژێر ئەو قاعیدەیە ئەوا ئێمە پێی دەڵێین : " نەخێر " هەڵەت کرد ، وە بەردەوام ئەهلی عیلم ڕا جیاوازی و إختلافیان هەبووە لە چەند بابەتێکی وەک ئەو بابەتانە وە نەبووە کەوا هەندێکیان هەندێکی تریان تەکفیر کردبێت .

باشە : لێرەدا کارێک هەیە ئەویش بەم شێوەیە جێگای گرنگی و بە هەند وەرگرتنە ، بەڵام ڕەنگە دوای بخەین بۆ وانەی داهاتوو بەڵام ئاماژەی بۆ دەکەم : ئەگەر زانیمان کە مناط ی کوفری بریتییە لە بەڕاست دانەنان و ڕەت کردنەوەی دەقە شەرعیەکان و نکۆڵی لێ کردنیەتی لەدوای ناسینی ، ئەوا جیاوازی دەکەین لەنێوان ئەو کەسەی کە دەوەستێت (لە تەکفیر کردنی کەسەکە) لەگەڵ ئەوەش کە حاڵی ئەنجام دەرەکەی بۆ دەرکەوتووە ، (ئەو تەقسیم و دابەش کردنەمان هەیە و دێینە سەری بەڵام ئێستا بەکورتی باسی دەکەم ) ، لێرەدا دابەش کردن و تەقسیم ێک هەیە کە پێویستە ضبط کردنی بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکانی ئەو قاعیدەیە :

**یەکەم** : کارەکە ظاهر و دیارە وە ئەنجام دەرەکەش حاڵی ظاهر و دیارە ، ئەوا هیچ پەناگە و ڕزگار بوونێکی نییە لە پێوە لکاندنی و پەیوەست کردنی حوکمی کوفر بۆ کەسێک کە ئەمە حاڵی بێت .

**دووەم** : کارەکە ظاهر و دیارە بەڵام حاڵی ئەنجام دەرەکە ظاهر نییە و نادیارە ، لێرەدا دەڵێین : لەسەرەتادا حوکمی کوفر پێوەی پەیوەست ناکرێت و نایگرێتەوە ، وە بەڵکو پێویستی بە بەڵگە هێنانەوە و گفتوگۆ و دەرخستن هەیە .

**سێیەم** : کارەکە خەفی و شاراوەیە ، جا لێرەدا بازنەی بەڵگە هێنانەوە و گفتوگۆ کردن دەبێت فراوان بکرێت ، واتە هەرکاتێک ( کارەکە ) دەرکەوت بوو بەئاشکرایی ئەوا بەڵگە هێنانەوە و گفتوگۆ کردنیش تەسک دەکرێتەوە ، وە هەرکاتێک کارەکە خەفی و شاراوە و نادیار بوو ئەوا بازنەی بەڵگە هێنانەوە و گفتوگۆ کردنەکەش فراوان دەکرێت ، بەم شێوەیە ...

**بنچینەی حەوتەم** : خەڵکی لەگەڵ ئەو قاعیدەیە دەبنە سێ جۆر :

**جۆری یەکەم** : مەبەستی حەقە وە دەشیپێکێت : وە ئەو جۆرەیان گومانی تێدا نییە کەوا پێکاویەتی چونکە الله هیدایەتی داوە ، لەبەرئەمە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) عەلی فێردەکرد و دەیفەرموو : (هەروەکو بە صەحیحی هاتووە) " ئەی عەلی لە دوعاکانتدا بڵێ : ئەی پەروەردگارا هیدایەت و ڕێنموونیم بکە و یارمەتیم بدە بۆ پێکاندن ، وە مەبەست لە هیدایەت دانیشت هیدایەت دانە بۆ ئەو ڕێگا ڕاستە وە مەبەست لە پێکاندنیش پێکاندنی تیرە " .

**جۆری دووەم** : ئەو جۆرەیە کە مەبەستی حەقە بەڵام هەڵە دەکات و ناپێکێت :جا ئەو جۆرە کەسانە درووست نییە هەڵسوکەوت کردن و پەلە کردن و دەستپێشخەری کردن بە وەصف کردنیان بەهەندێک جۆری وەصفی نا شەرعی چونکە ئەو جۆرە کەسانە مەبەستیان حەق بووە بەڵام نەیانپێکاوە ، وە مەبەستیان بنچینەیەکی باطل نەبووە کە باطل ەکەیان پێکابێت ، جیاوازی هەیە یان نا ؟ بەڵێ

جیاوازی هەیە ، ئێمە دەزانین کە کەسانێک هەنە کاریگەرن بە حەق بەڵام ناپێکن ، ئایا نەهاتووە لەوەی کە لە هەندێک لە هاوەڵانەوە وارید بووە ! بەم شێوەیە لە ڕووداوی قدامة کوڕی مظعون ؟ تەئویلیان کرد بەڵام ئەو تەئویلە چی بوو ؟ هەڵە بوو ، جا دەزانین کە کەسانێک هەنە مەبەستیان حەقە بەڵام ناپێکن ، بەڵکو بۆ هیچ کەسێکیش نییە پارێزراو بوون و نەکەوتنە ناو گوناھ و هەڵەوە ، ئایا هیچ کەسێک لە مرۆڤەکان هەیە معصوم و پارێزراو بێت لە کەوتنی بۆناو هەڵەوە ؟ نەخێر نییە ، بێجگە لە پێغەمبەران نەبێت ( سەلامی اللە لە هەموویان بێت ) لەوەی کە دەیگەیەنن لە پەروەردگاریانەوە ، بۆیە گومانی تێدا نییە کە ئەو جۆرە کەسانە ئومێدی هیدایەت و گەڕانەوە پێیان هەیە چونکە أصل نیەتی چاکە .

**جۆری سێیەم** : وە ئەو جۆرەش جۆرێکە کە مەبەستی ئەو هەواو ئارەزووەی لە نەفسیدا هەیەتی بێتەدی : (داوای سەلامەتی و پارێزراوی لە اللە دەکەین) جا نەفسی خۆی دەکاتە نوێنەر و کارەکانی پێ دەسپێرێت ، جا لە هیدایەت و پێکاندنیش بێ بەش بووە ، ئینجا دەبێتە کەسێکی گومڕا و گومڕاکەر

**بنچینەی هەشتەم و کۆتایی** : باسکردنی ضابط ی بابەتە ئاشکراکان و ضابط ی بابەتە شاراوەکان :

بەڕاستی ئێمە تاکو ئێستا هەر بەردەوامین لە پێشەکیەکان ، واتە ئێستاش نەچووینەتە ناوەڕۆکی بابەتەکە و لێی وورد نەبووینەتەوە لە بابەتەکانی ئەم قاعیدەیە ، لەبەرئەوەی ڕوونم کردەوە کە ئەو مەنهەجەی ئێمە لەسەری دەڕۆین لەم وانانەدا إن شاء اللە تعالى ، بنچینەدانانە پاشان دابەشکردن و فەرع دانانە ، لەبەرئەوەی ئەگەر بە فەرع دانانەکە دەستم پێ بکردبووایە وە بنچینەکانیش باس نەکرابا و ئامادە نەکرابوایە ( باشە چۆن دەبوو ئەگەر ئاوا بوایە ؟ ) ، ئەوا دەتبینی ڕەخنە گرتنێکی زۆر ، بەڵام کاتێک بنچینەکان جێگیر کران و ضبط کرا ئەوا ئاسوودە دەبن و ئاسوودە دەکرێن .

ضابط ی بابەتە ظاهر و ئاشکرا و دیارەکان : بریتییە لەوەی کە : هەموو زانستێک یان هەموو بابەتێک ئەگەر بەڵگەکانی ڕوون و ئاشکرا بوو وە ئومەتیش لەسەری کۆببوونەوە وە عیلمەکەی بۆ گشتی ( واتە گشت خەڵک ) و تایبەت ( واتە : کەسانی تایبەت وەک زاناکان ) ڕوون و ئاشکرا بێت .

ئەوە ئەگەر ضبط کرابێت ئەوا سوودمان پێ دەگەیەنێت لە مەسەلەیەک کە پێویستی بە بەڵگە هێنانەوە و گفتوگۆ کردن و ئاشکرا کردنە ، ئەگەر تێبگەیەنرێت .

جا بەڕاستی شتێکی زانراوە کە هەندێک لە خەڵکی وا گومان دەبات کە بەڵگە هێنانەوە و گفتوگۆ کردن و ئاشکرا کردن و دەرخستنی بابەتێک ئەوەیە کە داوا لە کەسێک بکات و بێت بۆلای ، پاشان دوای ئەمە نیو سەعات دابنیشێت و بۆی ڕوون بکاتەوە هەتاوەکو بە تێگەیشتنێکی تەواو لێی تێدەگات ، نەخێر هەموو ئەمانە قسەی دوورە لە ڕاستیەوە ، وە ئەمە مەبەستی سەلەف و ئەهلی عیلم نەبووە لەم بابەتەدا .

وە ئەگەر لێرەدا بابەتانێک هەبوو بەڵێ تێگەیشتن تێیدا بە مەرج دادەنرێت وە ئەویش لەوەی کە شاراوەیە لە بابەتەکان ، بەڵام ئەگەر بابەتێک لە بابەتەکانی أصول بوو (واتە لە ئەصلی دین بوو) ئەوا تەنها بە پێگەیشتنی بەڵگە بە زمان بەسە کە کەسی بەرامبەر لێی تێبگات و پێی بگات (کەسێکی عەرەب ڕوونکردنەوەکەی پێگەیشت بە زمانی عەرەبی کۆتایی دێت) ، (وە کەسی ئەعجەمی ڕوونکردنەوەکەی بە زمانی خۆی پێ گەیشت بەسە) ، تێدەگات تێناگات ئەمە شتێکی ترە .

لەبەرئەمە دەبینین کە لە سیاقاتەکانی قورئان زۆربەی لەوەی کە هاتووە ذەم و سەرزەنشت کردنە لەگەڵ ئەوەی کە حوججەی الله لەسەر موشریکەکان کرا ، لەگەڵ ئەمەش دەبینیت :

( **لهم قلوبٌ لا يفقهون بها ... ولهم آذانُ لا يسمعون بها** )واتە : دڵیان هەیە بەڵام پێی تێناگەن ( لە ڕاستی ) ... و گوێیان هەیە ( هەقی پێ ) نابیستن .

جا لێرەدا مەبەست بە بیستن بریتییە لە تێگەیشتن ، لەگەڵ ئەوەی کە بیستیان و حوججەی الله کرا لەسەریان تەنها بە بیستن ، مەرجە کە دەبێت ئەو بیستنە بە شێوەیەکی ڕێک و پێک پێی بگات ، کەسی عەڕەب خیتابی عەڕەبی پێی دەگەیەنرێت ، وە بەم شێوەیە ، کەواتە ضابط ی بابەتە ظاهر و ئاشکراکانمان زانی .

ضابط ی بابەتە خەفی و شاراوەکان : بریتییە لە هەر بابەتێک کە کەسانی تایبەت ( واتە زاناکان و ئەو کەسانەی کە علومی شەرعیان خوێندووە و... ) دەیزانن ، بەبێ ئەوەی گشت خەڵکی لێی شارەزا بن لەبەر شاراوەییەکەی و بەناو بانگ نەبوونەکەی .

بەڵێ بەم شێوەیە لە ضابط ەکانی ئەوەیە کە نەزانراوە بە زەرورەت لە دین ، جا هەر بابەتێک بە زەرورەت نەزانراو بوو لە دیندا ئەوا لەو بابەتە شاراوانەیە کە جودا دەبێتەوە عیلمەکەی بۆ کەسانی تایبەت بەبێ ئەوەی کە گشت خەڵکی لێی بزانن .

کەواتە ئەمە ئەو بنچینانە بوو کەوا حەزم کرد پێشی بخەم بەر لەوەی کە قسە دەربارەی بابەتەکانی ئەو بەشە یان ئەو قاعیدەیە بکەین بۆ ئەوەی دەست بکەین بە جیاکردنەوەکە .

جا دەست دەکەین بە یەکەم بابەت (ی ئەم قاعیدەیە) بە یارمەتی الله عز وجل :

ئەهلی عیلم خەڵکی لەم قاعیدەدا دابەش دەکەن بۆ چەند بەشێک :

بەشی یەکەم : کەسانێک هەنە کە دەق یان لەسەر هاتووە بە ڕوون و ڕاشکاوانە لەسەر تەکفیر کردنیان بەدیاری کراویەوە ، وە ئەوانیش دەبنە دوو بەش : طائیفە و کۆمەڵەکان ، وە شەخص و کەسەکان یان تاکەکان .

طائیفە و کۆمەڵەکان وەکو : یەهودی ، نەصرانیەت ، وە مەجوسی ، وە بوذی و هاوشێوەی ئەمانە ، إن شاء اللە ڕوونکردنەوەی حوکمەکانیش لەدوایەوە دێینە سەری .

وە شەخص و کەسەکان یان تاکەکانیش وەکو : فیرعەون و هامان و قارون و إبلیس یان أبو لەهەب ، وە هەر کەسێکە کە دەق بە ڕوون و ڕاشکاوانە لەسەری هاتووە بە ناوەکانیان و وەصف کردنیان بە دیاری کراویەوە بە کوفر .

جا بینا لەسەر ئەو بنچینە دانانە ، حوکمی ئەو بەشە بەم شێوەیەیە : هەر کەسێک بەکافریان نەزانێت و تەکفیریان نەکات بە موعەیيەنی و دیاری کراویەوە ئەوا ئەو کەسە کافرە ، وە ئەو کەسە دەچێتە ناو بنچینە و سەرەتای ژێر ئەو قاعیدەیە ، بۆچی ؟ لەبەرئەوەی بە زەرورەت زانراوە لە دیندا ، وە ئەمەش بنچینەکەمان بۆی دانا لە قاعیدەکەدا ، کە دەقی ڕوون و ڕاشکاوانەی تێدایە لە قورئانی پیرۆز ، وە بیناش لەسەر سەلامەتی ئەم جۆرە کەسانە کارەکەیان بە نکۆڵی لێ کردن و ڕەت کردنەوە دادەنرێت ، ئەو بابەتە مەسائیلەکانی خەفی و شاراوەی تێدایە یان ظاهر و ئاشکرا ؟ مەسائیلە ظاهر و ئاشکراکانی تێدایە ، ئەو بابەتەش ضبط کرا ، وە هەروەها بە هەمان شێوەی ئەمە بەڵگە دەهێنرێتەوە بە هەر ئایەتێک کە اللە تعالی تێیدا حوکمی بە کوفر داوە لەسەر هەموو ئەو کەسانەی کە نکۆڵی شتێک دەکەن لە ئایەتەکانی یان شتێک لە حوکمە شەرعیەکان کە دەقی لەسەر هاتووە ، کەواتە ئەوە بریتیی بوو لە بەشی یەکەم وە ئا ئەمەش حوکمەکەیەتی .

وە ئەهلی عیلم ( ڕەحمەتی اللە لێیان بێت ) ئیجماعیان گێڕاوەتەوە لەسەر کوفری هەرکەسێک کە تەکفیری ئەو بەشە نەکات یان پۆلێک لە خەڵکی ، وە لەوانەشی کە ئیجماعی لەمەدا گێڕاوەتەوە قاضی عەیاض ە ( ڕەحمەتی اللە تعالی لێی بێت ) هەروەکو چۆن لە کتێبەکەی [ الشِّفاء ] باسی کردووە ، وە ئەو کتێبەش لەڕاستیدا وەک ناوەکەیەتی " شیفاء " ، جا ئەگەر دڵ پاک و بێ گەرد بێت ئەوا بەڕاستی اللە

سبحانە وتعالی ئەو بەڵگانە دەکاتە شیفا بۆ گومانەکان وە دەیکاتە شیفا بۆ هەموو ئەو شتانەی کە بە بیرو هۆشی مروڤ وابەستە دەبێت .

وە ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) گێڕاویەتیەوە کە ئیجماع هەیە لەسەر کوفری هەرکەسێک کە تەکفیری یەکێک لە گاوڕەکان و یەهودی ناکات وە یان تەکفیری هەموو ئەو کەسانە ناکات کە لە دینی موسلمانان جودا بوونەتەوە ، یان وەستا لە تەکفیر کردنیان یان گومانی هەبێت لەمەدا ، جا ( رەحمەتی الله لێی بێت ) فەرموویەتی : " لەبەرئەوەی تەوقیف وە ئیجماع یەکدەنگن لەسەر کوفریان " سەرنج بدەن لەگەڵم ئەی براکانم " جا هەرکەسێک تەوقیفی کرد لەمەدا " واتە : کەسێک کە گومانی لێیان هەبێت یان بەڕاستیان دابنێت یان " هەرکەسێک تەوقیفی کرد لەمەدا ئەوا دەق بەناڕاست داناوە یان تەوقیفی کردووە " وە ئەمەش ئەوەیە کە بنچینەمان بۆی دانا پێش کەمێک لەوەی کە مناط ی کوفری لەم هەڵوەشێنەرەوەیە چییە ؟

سەیربکە چی چەسپاندووە قاضی عەیاض ( رەحمەتی الله لێی بێت ) ؟ ، بەڵێ " ئەوا دەق بە ناڕاست داناوە یان تەوقیفی کردووە یان گومانی تێدایە ، وە بەناڕاست دانان یان گومان تێدا بوون ڕوونادات تەنها لە کەسێکی کافر نەبێت " .

کەواتە سوودی چیمان وەرگرت لەم ووتەیەی کە نەقلمان کرد ؟ ژمارەیەک ئومور : ئیجماع بەستراوە لەسەر کوفری ئەو کەسەی کە تەکفیری ئەو بەشە ناکات ، وە زانیمان کە مناط ی تەکفیر لەم هەڵوەشێنەرەوەیە بریتییە لە ئینکاری و نکۆڵی کردن و ڕەت کردنەوەی حوکمی الله یان تکذیب و بە ناڕاست دانانی دەقێکی شەرعی .

وە بەهەمان شێوە الشیخ أبو بطین ئیجماعی گێڕاوەتەوە لەسەر هەرکەسێک کە تەکفیری یەهودی و گاوڕەکان ناکات و فەرموویەتی : " موسلمانان یەکدەنگن لەسەر کوفری ئەو کەسەی کە تەکفیری یەهودی و گاورەکان ناکات یان گومانی هەیە لە کوفریان " سەرنج بدەن " وە ئێمە دڵنیاین کە زۆربەشیان جاهیلن " بۆچی ؟

لەبەرئەوەی بابەتێکە کە بە زەرورەت زانراوە لە دین وە دەقی قەطعی و کۆدەنگی لەسەرە ، وە هیچ کەسێکیش نییە ( لە موسلمانان ) کە بێگومان ئەو ئایەتانەی خوێندووەتەوە کە بەڵگەیە لەسەر کوفری یەهودی و گاورەکان یان بەسەریدا خوێندراوەتەوە و گوێی لێ بووە .

جا ئەمە بابەتێکی ظاهر و ئاشکرایە ، وە هەروەها ئیجماعی لەسەرە ، وە دەقی قطعی تێدایە ، جا لێرەدا هیچ ڕێگایەک دانانرێت بۆ شاراوە بوونی ، وە ئێمە لێرەدا دەڵێین : ئەو کەسەی بیانوو دەهێنێتەوە بۆ ئەمانە ئەوا دەقی ئاشکرا و ڕوونی لەسەرە لەسەر کوفری ئەو کەسە ، وە ئەویش دەچێتە ناو بنچینەی ژێر ئەو هەڵوەشێنەرەوەیە ، یان ئەو قاعیدەیە .

وە بێگومان یەهودی و گاورەکان کافرن هەروەکو چۆن جێگیرمان کرد کە بە زەرورەت لە دین زانراوە دادەنرێت ، کەسانی گشتی و تایبەت جاهیل نین بە حاڵیان ، بەڵکو ئیمان و باوەڕ صەحیح نابێت بۆ هیچ کەسێک هەتاوەکو بیرو باوەڕی وادەبێت کە هەموو دینێکی پێچەوانەی ئیسلام باطل ە ، کەواتە ئا ئەمەیە بەشی یەکەم .

لێرەدا کارێک هەیە کە پێش کەمێک بەسمان کرد وە ڕەنگە بگەڕێینەوە بۆ باس کردنی إن شاء الله بەهەمان شێوە لە وانەی داهاتوو ، ئێمە وتمان : کردەوە هەیە ظاهر و ئاشکرایە وە ئەنجامدەرەکەشی ظاهر و ئاشکرایە ، وە کردەوەکە ئاشکرایە بەڵام حاڵی ئەنجام دەرەکەی شاراوە و نادیارە ، وە کردەوەش هەیە شاراوە و نادیارە ، جا گومانی تێدا نییە کەوا ئەمانە گشتیان لەسەر یەک پلە نین .

بەشی دووەم : لە بەشە پلە بەندیەکانی ژێر ئەو قاعیدەیە : کۆمەڵانێکن وە کردەوانێکن کە دەق هاتووە لەسەر تەکفیر کردنی هاوەڵەکانیان یان ئەنجام دەرەکانیان ، وەک إستغاثە و پەنا بردن و داوای فریاکەوتن لە غەیری الله عز وجل ، وە سەربڕینی ئاژەڵ بۆ غەیری الله ، وە سوجدە بردن بۆ غەیری الله وە هاوشێوەی ئەمانە ، وە حوکم کردن بە غەیری ئەو قورئانەی کە الله دایبەزاندووە ، وە إستهزاء و

گاڵتە کردن بە اللە یان بە دین یان بە پێغەمبەری دەست پاک ( علیه أفضل الصلاة والسلام ) وە تاکو کۆتایی ...، جا ئێستا دەچینە سەر تەفصیل و ڕوونکردنەوەی حوکمی ئەو بەشە .

دەڵێین : حوکمی ئەو کەسەی کە دەوەستێت یان گومانی هەیە لە کوفری ئەنجامدەری یەکێک لەم هەڵوەشێنەرەوانە ، ئەوا لەم چەند حاڵەتە بەدەر نییە :

حاڵەتی یەکەم : کە ئەویش زۆر ووردە ، ئەوەیە کە دەست هەڵدەگرێت لە تەکفیر کردنی ئەو کەسە ، چونکە پێی وایە ئەو کردەوەیەی کە کەوتووەتە ناویەوە کوفر نییە ، واتە دەڵێت : سەربڕینی ئاژەڵ بۆ غەیری اللە درووستە و کوفر نییە ، کەواتە ئەمە هەر لە بنچینەدا کەسێکی کافرە جا دەوەستێت لە کوفری ئەو کەسەدا یاخود نەوەستێت ، چونکە پێی وایە کە ئەو کردەوانەی کە بەڵگەی نەص بە ڕاشکاوانە لەسەر کوفری ئەنجام دەرەکەی هاتووە ئەوا ئەو کەسە پێی وایە کەوا ئەو کردەوانە کوفر نییە جا لێرەدا ئەمە ڕەت کردنەوە و تەکذیب و بە ناڕاست دانەری دەقی شەرعیە ، کە دەست هەڵدەگرێت لە تەکفیر کردنی ئەو کەسە لەبەرئەوەیە کە پێی وایە ئەو کارەی کە کەوتووەتە ناویەوە کوفر نییە ، وەک ئەوەی کە دەڵێت : سەربڕینی ئاژەڵ بۆ غەیری اللە ، یان حوکم کردن بە غەیری ئەو قورئانەی کە اللە دایبەزاندووە ، یان إستغاثە و هانا و هاوار و داوای یارمەتی کردن لە غەیری اللە ئەوا ئەمانە هیچیان کوفر نین ، وە ئەوە لەو شتانەیە کە اللە سبحانە وتعالی حەڵاڵی کردووە ئەوا کافر بوون دەیگرێتەوە ، داوای سەلامەتی و لەش ساغی لە اللە دەکەین .

حاڵەتی دووەم : سەرنجی ئەو جیاوازیە بدەن ( چونکە ئەمە مەسائیل و ئومورێکی دەقیق و ووردە ) : ئەویش ئەوەیە کە دەست هەڵدەگرێت لە تەکفیر کردنی کەسەکە لەگەڵ إقرار کردن و دانپێدانانی بەوەی کە ئەو شتەی ئەو کەسە کەوتووەتە ناویەوە بە موعەیيەنی و دیاری کراویەوە کوفرە ، وەک ئەوەی کە ( حوکمی کردووە بە غەیری ئەو قورئانەی کە اللە دایبەزاندووە ، جا دەڵێت : حوکم کردن بە غەیری

ئەوەی کە الله دایبەزاندووە کەمترین گومانم لێ نییە کەوا کوفرە ، سەربڕین بۆ غەیری الله ، دەڵێت کەمترین گومانم لێ نییە کە سەربڕینی ئاژەڵ بۆ غەیری الله کوفرە ) بەڵام دەست هەڵدەگرێت و واز دەهێنێت لە تەکفیر کردنی ئەو کەسەی کە ئەنجامی داوە لەگەڵ إقرار کردنیشی بەوەی کە ئەو شتەی ئەو کەسە کەوتووەتە ناویەوە بە موعەییەنی و دیاری کراویەوە کوفرە ، بەڵام دەست هەڵدەگرێت لە تەکفیر کردنی ( واتە : تەکفیریان ناکات ) لەبەرئەوەی مانع و ڕێگرێک هەیە کە ڕێگری لێ کردووە لە دابەزاندنی حوکم بەسەر ئەنجامدەری کوفرەکە ، وە هەروەها ئەمەش لە چەند حاڵەتێک بەدەر نییە :

دەبێت ئەو مانع ەی کە دەیگێڕێتەوە ( مُعتبر التنزيل صحيح ) بێت ، کەواتە چۆن تێبگەین لەمە ؟ چەند موانع ێکی موعتەبەر هەیە وە هەروەها چەند موانع ێکی غەیر موعتەبەریش هەیە ، وە چەند موانع ێکی موعتەبەر هەیە وە " التنزيل " تێیدا صەحیح نییە ، وە هەروەها چەند موانع ێکی موعتەبەر هەیە وە " التنزيل " تێیدا صەحیحە ، کەواتە ئەمە تەقسیماتە ، ( یەکێک لە ئامادە بووەکان دەربارەی شتێک پرسیاری لێ دەکات ) وە الشيخ یش ( تقبله الله ) وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت : چونکە هەموو ئەو کەسانەی کە دەکەونە ناو کوفرەوە دەبینیت کە تەئویلیان هەیە ، بەڵام مەرج نییە هەموو تەئویلێکیش قبوڵ بکرێت ، وە مەرج نییە هەموو مانع ێکیش ڕێگری لە دابەزاندنی حوکمەکە بکات بەسەریدا ، واتە بۆ نموونە : ئەگەر سەیری مانعی جەهل بکەیت دەبینیت کە چەند بابەتێک هەیە ئەهلی عیلم ئیجماعیان هەیە لەسەر إعتبار بۆ نەکردنی جەهل تێیدا وەک مانعێک ، وە چەند مانعێک یش هەیە ئەهلی عیلم إعتباریان بۆ کردووە کە جەهل تێیدا مانع ە ، دیاری بابەتەکان و شاراوەکانی کاریگەری هەیە ، بابەتە ظاهر و ئاشکراکان بە زەرورەت زانراوە لە دیندا جا ئەهلی عیلم هەروەکو چۆن بنچینەمان بۆی دانا و جێگیرمان کرد کە ئەنجامدانی شیرک لە بابەتە ئاشکراکان مرۆڤ کافر دەکات جا جاهیل بێت یان تەئویلی هەبێت .

کەواتە ئێستا دەگەڕێمەوە (سەر بابەتەکەمان) باسی دەست هەڵگرتووی یەکەممان کرد (لە تەکفیر) ، ئێستاش دەگەڕێینەوە سەر دەست هەڵگرتووی دووەم : " ئەوەیە کە دەست هەڵدەگرێت لە تەکفیر کردن لەوەی کە باسی دەقێک دەکات کە کارەکەی کوفرە لەگەڵ إقرار کردنینیشی کە ئەوەی کەوتە ناویەوە بە موعەیینەنی و دیاری کراوی کوفرە بەڵام دەستی هەڵدەگرێت لە تەکفیر کردنی کەسێکی دیاری کراو لەبەرئەوەی مانعێک هەیە کە ڕێگری لێ کردووە لە حوکم دانی بەسەر ئەو کەسەی کە کوفرێکی ئەنجام داوە .

باشە ، ئایا جیاوازی هەیە لەنێوان دەست هەڵگرتووی یەکەم و دەست هەڵگرتووی دووەم ؟ بەڵێ جیاوازی هەیە ، چونکە ناکرێت کە بڵێت ئەم کردەوەیە حوکمی شەرعی بەسەریدا دانەبەزیووە لەکاتێکیشدا ئەو کەسە کوفری ئەنجام داوە ، بەڵام دەڵێت " بەڵێ ، کوفری ئەنجام داوە ، بەڵام لێرەدا مانع هەیە بۆیە ڕێگری لێ کردووە لە پێوە لکاندنی حوکمی کوفر پێیەوە " ، ئێستا " کەسێک إکراهی لێ کراوە " قسەیەکی کوفری دەڵێت ، ئەی بۆچی پێی ناوترێت کافر ؟ چونکە ئەو مانع ە ڕێگری لێ کردووە لە پێوە لکاندنی حوکمی کوفر بە کەسەکە .....

وە خۆشەویستان و بەڕێزانم مەوانع هەیە موعتەبەرە لە هەموو مسائل و بابەتێکی ئیمان و کوفر بۆ نموونە وەک إکراه و زۆری لێ کردن ، وە موانع یش هەیە لە چەند بابەتێک موعتەبەرە ، بەڵام لە بابەتەکانی تر موعتەبەر نییە ، بۆیە لێرەدا خەلەل درووست دەبێت لە " گشتگیر کردن " ، دێت مانع ێک دەهێنێت کە ئەهلی عیلم ئەو مانع ەیان اعتبار بو کردووە لە بابەتێکدا کەچی گشتگیری دەکات بەسەر بابەتەکانی تریشەوە یان بە پێچەوانەوە ! ، واتە بۆ نموونە وەک : مانع ی ( جەهل ) ، ئەهلی عیلم اعتباریان بۆی کردووە لە بابەتە خەفی و شاراوەکان ، ئەگەر کەسەکە جاهیل بوو پێی ئەوا جەهل دەبێتە عوزر بۆی وە تەکفیر ناکرێت و نایگەیەندرێتە ناو کوفرەوە هەتاوەکو إقامە حوججە دەکرێت و تێدەگەیەنرێت .

بە مەرج دانانی تێگەیشتن و فەهم بۆ نموونە پێویستە کەوا بزانین ئەهلی عیلم إقراری ئەمەیان کردووە لە بابەتە خەفی و شاراوەکان ، جا ئەمە گشتگیر بکرێت بۆ بە مەرج دانان دا هەتاوەکو کەسانی وا لەناومان دەرچووە کە دەڵێت ئەو طاغوتانە کوفرەکانیان زانراوە وە کافر بوونیان شتێکی زانراوە لەلایەن بچووک و گەورەوە ، ئینجا دەڵێت : تەکفیر ناکرێت و ناگەیەنرێتە ناو کوفرەوە هەتاوەکو إقامە حوججە دەکرێت وە مەفهومی حوججەش لەلای ئەو کەسە هەر لە بنچینەدا ناتەواوە ، دەبێت ئەو کەسە بێت و دابنیشیت لەگەڵی ! پاشان لەدوای ئەمە بەڵگەکانی بۆ بخەیتە ڕوو و موناقەشەی لەگەڵ بکەیت لەکاتی باسکردنی هەر بەڵگەیەک ( ئینجا پێی بڵێت ) تێگەیشتیت یان تێنەگەیشتیت ؟ گەر تێگەیشتی دەچینە سەر بابەتێکی تر ، وە ئەگەریش تێنەگەیشتی هەر لە بابەتەکەی یەکەم دا دەمێنینەوە بۆ هەتا هەتایە ! ، پێغەمبەران ( سەلامی الله لێیان بێت ) ئەوانەی کە الله ناردنیانی کردە حوججە بەسەر گشت خەڵکدا ...

بەڵکو هەروەکو چۆن لە فەرموودەی أبو هورەیرە بە صەحیحی هاتووە کە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بە پێچەوانەی ئەمە فەرموویەتی : " سوێند بەوەی کە نەفسی محمدی بە دەستە ، هیچ کەسێک نییە لەم خەڵکەدا کە ناوی منی بیستبێ ( سەیربکەن چۆن کارەکەی بەستەوە تەنها بە [ گوێ بیست بوون ] ) هیچ کەسێک نییە لەم ئوممەت و خەڵکەدا کە ناوی منی بیستبێ ( لێرەدا مەبەست بە خەڵک [ ئومەتی دەعوەیە ] ) یەهودی بێت یان نەصرانی پاشان ئیمان نەهێنێت بەوەی پێی هاتووم ئیللا دەبێتە یەکێک لە ئەهلی دۆزەخ ) .

بەڵێ کەواتە لێرەدا جیاوازی هەیە لەنێوان دەست هەڵگرتنی یەکەم لەگەڵ دووەم دا ، جا کوفری یەکەم ڕوون و ئاشکرایە ، وە کوفری دووەمیش چەند حاڵەتێکی هەیە باسی دەکەین ، یان ئەوەی کە دووەم تێی کەوتووە لە دەست هەڵگرتن چەند حاڵەتێکی هەیە ( هەندێک بابەت هەیە تەصەور دەکرێت خەفی و شاراوە بوونی لە هەندێک کۆمەڵگادا وە ظاهر و ئاشکرا بوونیشی بە پێچەوانەوە لە هەندێک

کۆمەڵگای تردا ) . وە لە هەڵەکان : نەبوونی مەبەستە بۆ ئەنجام دانی کردەوە ، سەیری جیاوازیەکە بکەن ، تێکەڵی مەکەن لەنێوان نیەتی کردەوەی دڵ لەگەڵ ویستنی ئەنجام دانی کردەوە ، واتە بۆ نموونە : پیاوێک دەچێت بۆ شکاندنی بتێک بەردێک بەسەر قاچیدا بەردەبێتەوە ئەویش دەکەوێت بەسەر شێوەی کەسێکی سوجدە بەر ، ئەم کردەوەیە لە ڕووکەشدا کەوتن و چەمانەوەیە وە أصل لەو چەمانەوەیەش ـدا " چەمانەوەی ملکەچ بوون و سەر نەوی کردن و عیبادەتە " ، بەڵام چی ڕێگری لێ دەکات لە پێوە لکاندنی حوکم بەسەریدا ؟ ئەوا لێرەدا مەبەستی کرداری هەیە وە مەبەست و نیەتی دڵیش هەیە ... ئەوەی کە مورجیئەکان پێی تێکەوتبوون چی بوو ؟ دەیانگوت : نەخێر کافر نابێت هەتاوەکو بە دڵیشی مەبەستی ئەنجامدانی کردەوەکەی دەبێت ، وە ئەمەش لەگەڵ دەقە شەرعیەکان تێک دەگیرێن ، چونکە ئەهلی سوننە إقراریان کردووە و جێگیریان کردووە کە کوفر چەندین جۆری هەیە ، کوفر دەبێتە کوفر بە ووتە و کردار و بیرو باوەڕ و بە گومان و ئینکاری و نکۆڵی لێ کردن و پشت هەڵکردن وە تاکو کۆتایی ، جا مورجیئەکان گشت ئەمانەیان لە چی حەصر کردبوو ؟ لە بیرو باوەڕی دڵ ، واتە : کەسێک سوجدە بۆ غەیری الله دەبات ئەم کردەوەیە حوکمەکەی چییە ؟ کوفرە ، بەڵام لەلای مورجیئەکان کەی کافر دەبێت ؟ هەتاوەکو کەسەکە بیرو باوەڕی وا دەبێت کە ئەمە کوفرە ، وە ئەمەش لوتکەی إرجاء ـە ، " کە جەهمی بوونە " داوای سەلامەتی و لەش ساغی لە الله دەکەین ، کەواتە بیرو باوەڕمان وایە کەوا کوفر دەیگرێتەوە و پێوەی پەیوەست دەکرێت ئەگەر کەسەکە سوجدەی بۆ غەیری الله برد ، ئەگەچی لە دڵیشیەوە مەبەستی نەبووبێت ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لێرەدا لەم نموونەیەی کە باسکرا ، ئەمە مانع و ڕێگرێکی هەڵەیە ، حوکمەکە لێرەدا نایگرێتەوە ، بۆچی ؟ لەبەرئەوەی هەڵەیە ، چونکە ئەنجام دانی کردەوەکەی لێ دەرکەوتووە بەبێ ئەوەی مەبەستی ئەنجام دانی کردەوەکە بووبێت ، سەرنجی جیاوازیەکە بدەن ( ویستنی کردەوە لەگەڵ نیەتی دڵ ) جیاوازی لەنێوانیان هەیە ، کەواتە ئەو کەسەی

کە دەستی هەڵگرتووە لەگەڵ ئەوەش اقراری کردووە کە ئەو کەسەی بکەوێتە ناویەوە بە دیاری کراویەوە کوفرە چەند حاڵەتێکی هەیە :

حاڵەتی یەکەم : ( پێشتر باسمان کرد ) : ئەوەیە کە دەبێت ئەو مانع ەی کە دەیهێنێت موعتەبەر بێت وە دابەزاندن و دانانیشی صەحیح بێت ، جا ئەمە ناچێتە ناو قاعیدەکە ، ئەصلی کوفر نایگرێتەوە هەتاوەکو بڵێین ( هەرکەسێک تەکفیری کافرێک نەکات ئەوا ئەو کەسە کافرە ) جا من ئێستا پێتانم گوت هاوشێوەی ئەم نموونەیەی کە جێگیر بوو حوکم دان دەیگرێتەوە یان نایگریتەوە ؟ نایگرێتەوە ، جا بینا لەسەر ئەمە داخیل نابێتە ناو ئەو قاعیدەیە ، وە بێگومان قسەی ئێمە دەربارەی پیاوێکە حوکم دان گرتوویەتیەوە و دەست هەڵگرتنیش ڕوویداوە لە تەکفیر کردنی .

حاڵەتی دووەم : ئەوەیە کە دەبێت مانع ەکە موعتەبەر نەبێت یان موعتەبەر بێت بەڵام دابەزاندن و دانانی صەحیح نەبێت ، واتە بۆ نموونە : نموونە لەسەر مانع ی غەیر موعتەبەر ( واتە بەڵگە نەهاتووە لەسەر اعتبار بۆ کردنی وەک مانع ێک ) وەکو : ترسێکی زۆر کە ئەوەش هیچ ئەصلێکی نییە ، یان پیاوێک لەپێناوی دونیادا ، کەسێکیش پێی دەڵێت : بۆچی چوویتە نێو سوپای طاغوت ؟ پیاوێکی تر لەولا دێت و دەڵێت : ئەمە پیاوێکی غەریب و هەژار و لاوازە ، چەند منداڵێکی هەیە دەیکاتە بژێوی بۆیان ، جا ئێستا ئەو مانعەی کە هێنایەوە مانعێکی غەیر موعتەبەرە .

مەبەست لە موعتەبەر و دابەزاندن و دانانی غەیر صەحیح : بریتییە لە مانعێکی موعتەبەر بەڵام دانابەزێت و ناچێتە نێو هەندێک بابەت ، ڕەنگە کەسێک بێت نموونە بە جەهل بهێنێتەوە و بیکاتە مانع لە چیدا ؟ لە شیرکی گەورەدا ! پێت دەڵێین : مانعەکە موعتەبەرە بەڵام دابەزاندن و دانانی بە مانع صەحیح نییە ، چونکە لە هەندێک بابەت موعتەبەرە نەوەک لە گشت بابەتەکان ، جا حوکمی چییە ؟ دەڵێین : حوکم دان نایگرێتەوە لە سەرەتادا مەگەر دوای بەڵگە هێنانەوە و گفتوگۆ کردن و دەرخستنی بابەتەکان نەبێت ، بۆچی لێرەدا نەمانوت مناط تێیدا تەحقیق کراوە ؟

چونکە ئینکاری لێ نەکردووە بەڵکو إقراریشی کردووە کە هەرکەسێک ئەنجامی دا یان ئەو کردەوەیە کوفرە بەڵام دەڵێت مانعێک هەیە ڕێگری لە ئەنجامدەرەکەی دەکات لە پەیوەست کردنی بە کوفرەوە .....

لێرەدا دەچینە سەر ئەوەی کە هەندێک برا باسیان کردووە ، دەڵێن : کەی شوبهە و گومان دەردەکەوێت وە إقامە حوججەش دەکرێت ؟ ئەو بنچینانەمان هەیە کە باسمان کرد بۆتان ، ئەگەر کردەوەکە ظاهر و ئاشکرا بوو وە حاڵی ئەنجامدەرەکەشی ظاهر و ئاشکرا بوو ، ئەوا لێرەدا بازنەی بەڵگە هێنانەوە و گفتوگۆ کردن تەسک دەکرێتەوە یان فراوان دەکرێت ؟ تەسک دەکرێتەوە ، بەڵکو لەوانەیە بازنەیەکیشی تێدا نەدۆزیەوە ! وە ئەگەر کردەوەکە ظاهر و ئاشکرا بوو وە حاڵی ئەنجام دەرەکەشی خەفی و شاراوە بوو ، ئەوا لێرەدا فراوان دەبێت .

کەواتە کەسێک کە نایەتە لامان بۆئەوەی مەسەلەیەک کە پێویستی بە گفتوگۆکردن و بەڵگە هێنانەوە و دەرخستنە باس بکرێت ، وە نایەتە لامان بۆ مەسەلەیەک پێویستی بە بەڵگە هێنانەوە و دەرخستنە طەرح بکات ، ئەوا دەڵێین ئەمە بە گوێرەی کردەوەکە و حاڵی ئەنجام دەرەکەیەتی .

لێرەدا بابەتێک هەیە دەچینە سەری وەک ئاگاداریەک : (دابەزاندن و دانانی حوکمەکان بەسەر کەسێکی موعەییەن و دیاری کراو ، کە ئەویش لەو بابەتانەیە کە دەوەستێت لەسەر ڕەچاو کردن و هەوڵدانێکی شیاو لەم بابەدا ، جا هەرکەسێک خاوەنی ئەو ئالەتە بوو درووستە بۆی قسە کردن تێیدا و ڕەچاو کردن لەم بابەتە وە هەرکەسێک وانەبێت ئەوا نەخێر )

بەڵگەی ئەمە لە کوێیە ؟ دابەزاندن و دانانی عیلم وە سەرنج بدەن کەوا ئێمە ئێستا قسە دەکەین لەسەر ئەوەی هەرکەسێک کافرێک بە کافر نەزانێت ، وە (سەر لێ شێواندن ) دەربارەی ئەو کەسەی کە تەکفیری کافر ناکات کە کوفر لەو کەسانەی کەوتوونەتە ناویەوە دەرکەوتووە ، ئەوا دەچینە سەر ئەوەی کە قسە کردن دەربارەی

